

ڕێکخراوی کوردزاگ
هۆشیاری نەتەوەیی

ڕێکخراوی کوردزاگ

بەشی ڕێکخستنەکان

ڕێکخەرانی ڕێنمایی

# (ڕێنماییەکانی کۆڕەکانی تانە لێدان)

# (تایبەت بەهێرشی ئەلیکترۆنی)

ئامادەکردن: کوردزاگ

٢٠٢٤

# بەشی یەکەم

## تایبەت بە ناو کۆڕەکانی تانە لێدان

**ماددەی یەکەم:** مەبەست لەم زاراوانەی لە ڕێنماییەکەدا هاتوون، ماناکانیان لەبەرامبەردا نووسراوە:

کوردزاگ: ڕێکخراوی کوردزاگ.

تانە لێدان: (ڕیپۆرت) کردن.

کۆڕ: (گرووپ).

**ماددەی دووەم:** چۆنیەتی بوون بە ئەندام لەکۆڕەکان:

1. پێویستە ئەو کەسەی دێتە ناو کۆڕەکان بەتەواوەتی کەسێکی نەتەوەیی بێ یان نیشتیمانیی و لەخەمی کوردستاندا بێ.
2. پێش ئەوەی بێتە ناو کۆڕەکە دەبێ نامە بۆ یەکێک لەسەرپەرشتیارانی کۆڕەکە یان سەرپەرشتیارانی کوردزاگ لەتۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بنێرێ.
3. پێویستە ئەندام پێش ئەوە بچێتە کۆڕەکە ناوی سیانی و شوێنی نیشتەجێبوون و تەمەنی خۆی بە نامەیێک بۆ سەرپەرشتیار بنێرێ.
4. پێویستە ئەندام کورد بێ.

**ماددەی سێییەم:** چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئەندامان لەکۆڕەکە:

یەکەم

1. نابێ هیچ پرسیارێکی شەخسی لەهیچ ئەندامێک بکەی، وەکو شوێنی نیشتەجێبوون و تەمەن.
2. نابێ نامە بۆ هیچ ئەندامێک بنێری لەتایبەتی.
3. نابێ باسوخواسی فکر و ئایینی و مێژوو و کلتوور...هتد بابەتێک بکرێ لەدەرەوەی تانەلێدانی ئەلیکترۆنی بێ.
4. ئەندام بە گشتی نابێ بێزارکەر بێ و نامەی زۆر بنێرێ لەکۆڕەکە، تەنانەت با پرسیار کردنیش لەتایبەتی بێ بۆ سەرپەرشتیارانی بنێرێ.

دووەم:

1. پێویستە کاتێک پێگەیێک دادەنرێ بۆ تانەلێدان (ڕیپۆرت) ئەندامان بیسەلمێنن کە تانەیان لێداوە بەشێوازێک وێنەی تانە لێدانەکە بگرن (سکرین شووتی بکەن) و بینێرن بۆ کۆڕەکە.
2. لەماوەی ٣ ڕۆژدا دەبێ (سکرین شووت) بنێردرێ بۆ کۆڕەکە و بسەلمێنرێ کە (ڕیپۆرت)ی کردووە.
3. ئەندام پێویستە چالاک بێ و بەردەوامی هەبێ و بەکارەکانی هەستێ.

**ماددەی چوارەم:** مافەکانی ئەندام لەکۆڕەکە:

1. هەموو ئەندامێک بۆی هەیە ئەو پەیج و ئەکاونتانە بنێرێ بۆ سەرپەرشتیاران و داوا بکا کە (ڕیپۆرت) بکرێن، چۆن:

- پێویستە بەتەواوەتی پەیجەکە بناسێنێ و خاڵە نەرێنیەکان بنووسێ لەیەک نامەدا بەتایبەتی وەکو کەیسێک بۆ سەرپەرشتیاری بنێرێ نابێ بچێ ئەکاونت و پەیجەکە بۆ کۆڕەکە بنێرێ.

2. هەموو ئەندامێک دەتوانێ تانە بدا لەبڕیار و هەڵبژاردنی سەرپەرشتیارەکان، بۆیە سەرپەرشتیارەکانیش وەڵامی دانەو بڕیارەکەی دەبێ بدەنەوە.
3. هەموو ئەندامێک دەتوانێ تانەو گومان لەئەندامێکی دیکە بدا بەمەرجێک بەڵگەو زانیاری لەسەر هەبێ، دەتوانێ لەکاتی گومانیش سەرپەرشتیاران ئاگادار بکاتەوە.
4. هەموو ئەندامێک ئارەزووی خۆیەتی کە بچێتە دەر لەکۆڕەکە یان بێتە ناو(بەپێی یاساکان)
5. ئەندامەکان دەتوان فێرکای و شێوازی تایبەتی (ڕیپۆرت) لەکۆڕەکە بڵاوکەنەوەو داینێن.

**ماددەی پێنجەم:** کارەکانی سەرپەرشتیاران:

1. دەبێ سەرپەرشتیاران وەڵامی ئەندامانی کۆڕەکە بدەنەوە لەتایبەت و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن دەربارەی کەیسەکەیان.
2. سەرپەرشتیاران پێویستە چۆنیەتی ڕیپۆرت کردن هەڵبژێرن و فێرکاری بڵاوکەنەوە لەکاتی هەڵبژاردنی پێگەیێک بۆ تانە لێدان.
3. سەرپەرشتیاران دەبێ ئەو کەسانە ئاگادار بکەنەوە کە تانەکانیان نانێرن بە سکرین شووت.

4. پێویستە هەر سەرپەرشتیارێک بە وردی ئاگاداری یاساو ڕێسا و ڕێنماییەکان بێ.

# بەشی دووەم

## ڕێکخستنەکانی تایبەت بە کۆڕەکان

**ماددەی شەشەم:** تایبەت بە ڕێکخستنی پێگەکان:

1. تەلەگرام:

1. جەناڵێکی تایبەتی لەتەلەگرام دەکرێتەوە بەناوی 07KCA.
2. هەرکاتێک پێگەیێک دادەنرێ بۆ ئەوەی تانەی لێ بدرێ پێویستە لەم جەناڵە بڵاو بکرێتەوە.
3. لەکاتێکدا ئەندامان زۆر بوون دەتوانرێ کۆڕێک لە تەلەگرام بکرێتەوە.

2. مێسنجەر:

1. کۆڕێک لەمێسنجەر بۆ کوران دەکرێتەوە بەناوی KCA.
2. کۆڕێک بۆ کچان دەکرێتەوە بەناوی KCA-کچان.
3. هەر کاتێک ئەندامان ڕێژەیان زۆر بوو دەتوانرێ کۆڕی زیاتر بکرێتەوە.

3. ئینستاگرام و تۆڕەکانی دیکە:

هەرکاتێک خواست زۆر بوو لەسەر تۆڕەکانی دیکە ئەوا دەتوانرێ پێگە لەم تۆڕانەش بکرێتەوە.

**ماددەی حەوتەم:** ڕێژەی ئەندامان:

1. پێویستە لە کۆڕێ کوڕان ڕێژەی ئەندام 25 کەس بێ یان زیاتر ئەگەرنا هیچ چالاکییێک ناکرێ.
2. پێویستە لە کۆڕی کچان ڕێژەی ئەندام 15 کەس بێ یان زیاتر ئەگەرنا هیچ چالاکییێک ناکرێ.

# بەشی سێیەم

## تایبەت بە سزاکان

**ماددەی هەشتەم:** تایبەت بە سزای ئەندامان:

1. هەر کەسێک ماددەی دووەم جێبەجێ نەکا بەهیچ شێوەییێک نابێ بهێنرێتە کۆڕەکە.
2. هەر کەسێک نامەی زیادە بنێرێ جگە لە سکرین شووتی تانە لێدان 3 جار ئاگادار دەکرێتەوە ئەگەر هەمان هەڵەی دووبارە کردەوە ڕاستەوخۆ دەردەکرێ.
3. هەر ئەندامێک بچێتە چاتی تایبەتی پرسیار و گفتوگۆ لەگەڵ ئەندامانی کۆڕەکە بکا دەربارەی کۆڕ یان هەر بابەتێکی دیکەی پەیوەست بەکۆڕەکە ڕاستەوخۆ دەردەکرێ.
4. ئەگەر ئەندام ماددەی سێیەم ڕێسای دووەم خاڵی 1و2و3 جێبەجێ نەکا 3 جار ئاگادار دەکرێتەوە ئەگەر جێبەجێی نەکرد ڕاستەوخۆ دەردەکرێ.

5. نابێ ئەندام بچی سکرین شووتی چاتەکە بگرێ و بینێرێ بۆ شوێنێکی دەرەکی ئەگەر ئاشکرا بێ و بچەسپێ لەسەری ئەوە دەردەکرێ.

ماددەی نۆیەم: سزای سەرپەرشتیاران:

1. ئەگەر سەرپەرشتیاران بۆ چەند جارێک ئەندامان پشتگوێ بخەن لە چاتی تایبەتی ئەوا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ.
2. هەر سەرپەرشتیارێک کێشەی تایبەتی تێکەڵ بکا بە پرسەکە ئەوا دەردەکرێ.
3. سەرپەرشتیاران لەناو خۆیان کارەکان دابەش دەکەن، ئەگەر هەر یەکێکیان بەکارەکەی هەڵنەستا بۆ 3 جار ئاگادار دەکرێتەوە ئەگەر جێبەجێی نەکرد دەردەکرێ.

# بەشی چوارەم

## پێشنیار

**ماددەی دەیەم:** ئەگەر هاتوو تانە لێدانەکان بۆ چەند جارێک جێبەجێ نەبوون و ئەم پڕۆژەیە سەری نەگرت ئەوا دەتوانرێ بەپێی دەنگ و داواکاری پڕۆژەی تانە لێدان بگۆڕدرێ بۆ (سپام) کردن.

# هۆکاری پێویست بۆ دەرکردنی ئەم ڕێنماییە:

ڕەوتی نەتەوەیی بەسەرپەرشتی کوردزاگ بوژانەوەیێکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێ و ڕۆژانە فراوان دەبێ لەگەڵ ئەم فراوان بوونە ئەندامان و بەڕێوبەران زیاتر خۆنەویستانەو قازانج نەویستانە سەرەڕای ژیانی تایبەتی ڕۆژانەیان هەمیشە چالاکانە پێگە نەتەوەییەکان بەڕێوەدەبەن و ئەرکێکی زۆریان کەوتۆتە ئەستۆ، کردنەوەی کۆڕی نوێ و پێگەی تایبەتی بۆ ئەوەی لەسەر ڕێڕەوی خۆی بمێنێتەوە و فەوزا درووست نەبێ پێویستی بە یاسا و ڕێنمایی تایبەتی هەیە تاوەکو هەموو کەسێک ئامانجی هاتنە ناو کۆڕەکەی هەیە پێش وەختە زانیاری و ڕێنمایی وەرگرێ، بۆ ئەوەی هەرکاتێک ڕووبەڕووی سزاییێک یان دەرکردن یان کپ کردن بۆوە تێبگا لەبەرچیە.

ئەم یاساو ڕێنماییانە بۆیە دانراوە تاوەکو هەرکاتێک سەرپەرشتیاران گۆڕان یان کەسانی نوێ هاتن و کۆڕەکانیان گرتە دەست لەسەر ئەم یاساو ڕێنماییانە بمێننەوەو یان باشتری بکەن لەپێناو جڵەوکردنی کۆڕەکە.

نە سەرکردە نە سەرۆک تاوەکو سەر نامێننەوە، ئەوەی دەمێنێتەوە یاساکان و ئامانجەکانمانن.

**کوردزاگ**